زنجیرەی مێژوو بۆ لاوان (١٦)

ناوی کتێب: ناپلیۆن

نووسەر: ڕیچارد تیمز

و. له فارسییەوە: ئاگری ئەفشین

چاپ: ئەلکترۆنی

ساڵ: ٢٠١٨

## ناوەڕۆك:

# ناپلیۆن، جەنەڕاڵێك كە لە ڕێی فەڕانسەدا دەجەنگێ

چەكداری تۆپخانەی فەڕانسە ١٧٩٠ تا ١٨١٥

ناپلیۆن لە سـاڵی ١٧٦٩ لە خێزانێكی نەجیبزادە هاتە دونیاوە و دووهەمین كوڕی بنەماڵەكەی بوو. ناپلیۆن خەڵكی بوناپارت بوو كە لە دورگەی كورس دەژیا، ئەو دورگەیە دەكەوێتە دەریای مەدیتەرانە كە لەو سەردەمەدا تازە كەوتبووە سەر فەرمانڕەوایی فەڕانسە. ناپلیۆن كەسێكی زیرەك بوو بۆیە بۆ خوێندن چوو بۆ فەڕانسە بۆ قوتابخانەیەكی سەربازی. ناپلیۆن لەبەرئەوەی خەڵكی فەڕانسە نەبوو، قوتابیەكانی دیكە لاساریان لە گەڵ دەكرد، بەڵام مامۆستاكانی پێیان وابوو كە ئەو قوتابێكی شایستەو زیرەكە. لە پەروەندەی قوتابخانە بەم شێوەیە لەبارەی ناپلیۆنەوە نوسرابوو: ((ئەو لە ڕووی جەستەیی و دەرونییەوە بێ كێشەیە،؛ لە ڕوانگەی ڕەوشت، گوێڕایەڵی و بەرپرسیاریەتی، كەسێكی نەجیب و ڕێك و پێكە؛ و هەروەها بە هۆی كاركردنی زۆری لە سەر وانەی بیركاری ئەوا پێش قوتابیەكانی دیكە كەوتۆتەوە، بەڵام لە یاری زوبین و سەما كردن زۆر لاوازە)).(زوبین: نێزەكێكی بچوكە كە لە زەمانی كۆن لە جەنگدا بە كار دەهات)

ناپلیۆن لە ساڵی ١٧٨٤ خوێندنی سێ ساڵەی قوتابخانەی سەربازی بە یەک ساڵ کۆتای پێهێنا و لە تەمەنی شازدە ساڵی بوو بە ملازمی تۆپخانە، ئەو بەشەی سوپا کە زیاتر سەروکاریان لە گەڵ چەکی قورسە.

شۆڕی فەڕانسە لە ساڵی ١٧٨٩ دەستی پێکرد و ناپلیۆن هەر لە سەرەتاوە داکۆکیکەر بوو، و بۆی دەرکەوت کە شۆڕش دەتوانێ دەرفەتێکی باش بڕەخسێنێت بۆ کەسانی لێهاتوو وبە توانای وەك خۆی. ئەفسەرانی سوپا بەختەوەربوون. زۆرێك لە ئەفسەرە دەوڵەمەندو نەجیبزادەکان لە کاتی بە کۆماری بوونی فەڕانسە ئەو وڵاتەیان بە جێ هێشت. دەستپێکی جەنگی فەڕانسە لە گەڵ هێزەکانی دیکەی ئەوروپا بووە هۆی بەهێزبوونی سوپای فەڕانسە، لەم ڕوویەوە دەرگای سەرکەوتن بۆ زۆرێك لە ئەفسەرەکان والا کرا.

ناپلیۆن ئەوەی نیشان دا کە لە جەنگی سەربازی قارەمان و لێهاتووە. چووە پاریس کە ناوجەرگەی شۆڕشەکە بوو. لەو کاتەدا کۆمیتەیەك بە ناوی کۆمیتەی دایرکتر(بەڕێوەبەرایەتی) حوکمڕانی فەڕانسەی دەکرد. ناپلیۆن هاوکاریی یەکێك لە بەڕێوەبەرەکانی ئەم کۆمیتەی کرد، واتە سوودی لە هێز و دەسەڵاتەکەی وەرگرت و خۆپیشاندەرانی سەرکوب کرد. لەم هێرشەدا ٣٠٠ کەس لە خۆپیشاندەران کوژران. بە هۆی ئەم کارەیەوە پلەی بەرزکرایەوە بۆ جەنەڕاڵ و بوو بە فەرماندەی سوپا لە ئیتالیا کە لەو کاتەدا تەمەنی ٢٧ ساڵ بوو.

لە ساڵی ١٧٩٦ دایرکتر پلانی داڕشت بۆ هێرش کردنە سەر بەهێزترین دوژمنی، واتە نەمسا بۆ ئەوەی بە یەکجاری ئەرخەیان بێت لە هەر هێرشێکی دەرەکی. پلانەکە ئەوەبوو کە گورزی سەرەکی، هێرشی ڕاستەوخۆ بێت بۆ سەر پایتەختی ئەو وڵاتە. هێزی چل هەزار کەسی ناپلیۆن، کە چەك و ئازوقەی کەمیشیان پێ بوو، دەبوایە لە ئیتالیاوە هێرشیان کردبایە سەر نەمسا بۆ داگیرکردنی ئەو وڵاتە. بەڵام هەموو شتێك پێچەوانە بوویەوە، سوپای سەرەکی فەڕانسە تێکشکا، بەڵام ناپلیۆن بە بێ وەستان بەرەو پێش دەچوو. ناپلیۆن فەرمانەکانی دایرکتری پشت گوێ خست و خۆی بە تەنیا لە گەڵ نەمسا پەیماننامەی ئاشتی واژۆ کرد، و بە هۆی ئەم بابەتەوە چەند ناوچەیەکیش کەوتە سەر خاکی فەڕانسە. ناپلیۆن ئەوەی سەلماند کە هەم دەتوانێ فەرماندە بێت هەم سیاسەتمەدارێکی لێهاتووش.

ناپلیۆن بوو بە قارەمانی فەڕانسە. دایرکتر لە پێش چاوی خەڵك کەوتبوو، بەڵان ناوبانگی ناپلیۆن ئەوانی هێشتبووەوە. بەڕێوەبەر و ئەندامانی دایرکتر ترسی ئەوەیان هەبوو کە ناپلیۆن دەسەڵات بۆ سوودی خۆی بە کاربهێنێت و شوێنی ئەوان بگرێتەوە. لەم ڕووەوە کاتێك لە ساڵی ١٧٩٨ ناپلیۆن بڕیاری دا هێرش بکاتە سەر میسر، ئەوان پێشبینی چاکیان دەکرد. پلانی ناپلیۆن ئەوە بوو کە میسر داگیر بکات و ڕێگای بازرگانی نێوان بەریتانیا و مەدیتەرانەی ڕۆژهەڵات دابخات و پەیوەندی لە گەڵ ئیمپراتۆریەتەکەی لە هیند بپچڕێنێت.

جەنگی ئەهرام ١٧٩٨

ئەوروپا لە ساڵی ١٧٨٥. ئەڵمان و ئیتالیای نوێ لە ژمارەیەکی زۆر لە وڵاتانی جیاواز دروست بوو.

ناپلیۆن هێزی فەرمانڕەوایی میســری لە جەنگی ئەهرام لە ناوبرد، دواتر نەهامەتی ڕوبەڕوی بوونەوە. نێلســۆن، فەرماندەی دەریایی ئینگلتەرا، دەریاوانە فەڕەنســیەکانی نابود کرد، ســوپای فەڕەنســە کەشــتیەکانی کەل و پەل گواســتنەوەی لە دەســتدا. ناپلیۆن پیاوەکانی بەرەو باکووری ســوریا جوڵاند و لە عەککا وەســتا و دواتر گەڕایەوە بۆ میسر و لە وێڕا سواری کەشتی بوو بە مەبەستی گەڕانەوە بۆ فەڕەنسە کەوتە ڕێ و هەموو سوپاکەشی جێهێشت.

کاتێك کە ناپلیۆن گەشــتەوە فەڕەنســە بینی هێشــتا دایرکتر بێ توانا و بێ متمانەیە لە ناو خەڵکدا. هاوپەیمانیەکی نوێ لە دژی فەڕەنســە دروست ببوو کە پێکهاتبوو لە بەریتانیا، نەمسا، ئیمپراتۆری عوسمانی، ســوید و ڕوســیە. یەکێك لە بەڕیوەبەرانی دایرکتر پێشــنیاری خڕ کردنەوەی دایکتری کرد و داوای کرد حکومەتێکی ســەربازی بەهێز ڕابگەیەنن کە بتوانن ڕووبەڕووی دوژمن ببنەوە. بە پێی ئەم دەرئەنجامە وایان دانا کە فەرماندە ناپلیۆن بۆناپارد ببێتە داوەڵی ئەم حکومەتە. واتە دەیانویســت کە ناپلیۆن تەنیا بە نێو ســەرکردە بێت بەڵام بە شــێوەی فەرمی هیچ هێزێکی نەبێ، بەڵام ناپلیۆنیش هێز و دەســەڵاتی بۆ خۆی دەویســت. دوای یەك ســاڵ هەر ئەو بەڕێوەبەرە بە ســەنا(پەرلەمان)ی ووت: (بەرێزان! ئێوە گیری کەســێکتان خواردوو کە هەموو شتێك دەزانێ و هەموو شتێکیشی دەوێ و هەرکارێکیشی بوێ دەتوانێ بیکات)

(( لە ســاڵی ١٧٩٩ کوودەتایەك کرا و کۆتایی بە دەســەڵاتی دایرکتر هێنا. حکومەتێکی نوێ جێگەی کردتەوە بە ناوی کۆنســولات کە تا ســاڵی ١٨٠٤ دەوامی هێنا.م.ف))

ناپلیۆن لە پلەی کۆنســوڵی یەکەم.
ناپلیۆن لەو کاتە ٣٠ ساڵ بوو.

ناپلیۆن ئالپ تێپەردەکات. ئەم تابلۆیە وێنەی خەیاڵی ناپلیۆن نیشان دەدات. لە ڕاستیدا ناپلیۆن بە هێستر بە ئاڵپدا

## ناپلیۆن و کۆنسولات: مۆدێرنیزە کردنی فەڕانسە

دوای دایرکتر، سیستەمێکی حکومەتی نوێ هاتە سەر کار بە ناوی کۆنسولات، کە پێك هاتبوو لە سێ کۆنسوڵ، بەڵام دوای ماوەیەکی کەم ناپلیۆن ئەوەندە بەهێز بوو کە کەس حیسابی بۆ دوو کۆنسوڵەکەی دیکە نەدەکرد. خەڵکی فەڕانسە پشتیوانیان لە ناپلیۆن دەکرد، لەبەرئەوەی حکومەتێکیان دەویست کە ئاسایش بگەڕێتەوە بۆ شار و بتوانێ لە جەنگدا سەرکەوتوو بێت. کۆنسوڵی یەکەم واتە ناپلیۆن لە جەنگ سەرکەوتنی بەدستهێنا.

هێرشەکانی ناپلیۆن

نەمسا شکستی خوارد و ناچار پەیماننامەی ئاشتی واژۆ کرد. سنووری فەڕانسە تا ڕووباری ڕاین درێژ بوویەوە و وڵاتەکانی هۆڵەند و سویسرا کەوتنە ژێر دەسەڵاتی فەڕانسە. ڕوسیە کە پشتیوانی نەمسای لە دەستدابوو، بە جیا لە گەڵ فەڕانسە پەیماننامەی ئاشتی واژۆ کرد. لە ساڵی ١٨٠٢ بەریتانیاش ئاشتی پەسەند کرد، بەڵام ساڵێکی نەخایاند کە جەنگ لە نێوان بەریتانیا و فەڕانسە ڕوویدا.

گرنگترین کاری ناپلیۆن لە مەقامی کۆنسـوڵی دا بوو لە ناوخۆی فەڕانسـە. ئەو بە پێی شـایسـتە بوونیان ئەو کەسانەی دیاریدەکرد کە لە حکومەتدا خزمەتیان دەکرد. لە دووی کەسی ژێر دەگەڕا. ئەوەی لە بۆی گرینگ بوو تەنها گوێڕایل بوون بوو، ئیدی بۆ گرنگ نەبوو کە ئەو کەسـانە پێشـتر نەجیبزادە بوون یان لە شـۆڕشـگێڕە توندڕەوەکان. ناپلیۆن بە هاوکاری ئەم کەسـانە بەردەوام بوو لە چـاکسـازی کە بە هۆی شـۆڕشـەوە دەسـتی پێکردبوو.

لە ڕاستیدا ئەوە ناپلیۆن بوو کە سیستەمەی نوێی حکومەتی ناوچـەیی لە فەڕانسـە بەرپا کرد. شـۆڕش، نەزم و ڕێکخسـتنێکی بەخشـی بوو بە حکومەتی ناوچـەیی نوێ، واتە وڵات دابەش کرابوو بۆ (دیپارتمان) یان ناوچـەی یەکسان. تا ناپلیۆن دەسـەڵاتی نەگرتبووە دەست ئەم سیستەمە نوێیە کاریگەریەکی ئەوتۆی نەبوو. ناپلیۆن بۆ هەر دیپارتمانێك کەسـێکی دیاری کرد بۆ بەڕێوەبردنی، کە پێی دەوترا (کاملان). ئەم کەسـانە گوێڕایەڵی فەرمانەکان بوون کە لە پاریس لە ناپلیۆنەوە دەهاتن. ئەم سیاسـەتە دەرفەتێکی باشـی بۆ ناپلیۆن ڕەخساند کە چاکسازی لە بەشەکانی دیکەشدا بکات.

بەر لە شـۆڕش یاسـاکانی فەڕانسـە زۆر تێکەڵ و پێکەڵ بوون. ئەم یاسـایانە پێکهاتبوون لە داب و نەریتی کۆن، فەرمان و دەستووری پاشاکان و بیروڕای دادگاکان. هەندێك جار ئەم یاسایانە دژ بەیەك بوون و پەی بردن بەوەی کە یاسا لە بارەی فلان بابەتەوە چـی دەڵێ، کارێکی زۆر دژوار بوو. شـۆڕشـگێڕەکان هەندێك لە یاسا کۆنەکانیان وەلانابوو و یاسای نوێیان لە جیاتی دانابوو. ئەو کاتەی ناپلیۆن دەسـەڵاتی گرتە دەست یاساکان لە پێشـتر زیاتر تێکەڵ و پێکەڵتر بوون. ئەو دەیزانی کە حکومەت چاوەڕوانی ئەوەی لە خەڵکەکەی هەیە کە گوێڕایەڵی یاسا بن، کەوابوو دەبێ یاسـاکان ڕۆشـن بن و هەمووان لێی تێبگەن. لەبەر هەندێ ناپلیۆن فەرمانی دا کە کۆمیتەیەك لە پارێزەرەکان پێك بێنن بۆ ئەوەی هەموو یاسـاکان پێکەوە کۆ بکەنەوە، و ئەو یاسـا کۆنانە وەلا بنێن کە پێچـەوانەی یاسـا نوێیەکانە. دەرئەنجامی ئەم کارە بریتی بوو لە بەدیهێنانی کۆمەڵە یاسـایەك، کە بە کۆدی ناپلیۆن یان یاسانامەی ناپلیۆن نێوبانگی دەرکرد. ئەم یاسانامەیە بوو بە سەرمەشقێك بۆ چاکسازی یاساکانی زۆرێك لە ولاتان. ناپلیۆن بۆ خۆی دەیووت کە ئەو زیاتر شانازی بە یاسانامەکەیەوە دەکات تا فتوحاتەکانی. ئەم یاسـانامەیە پشـتیوانی زۆرێك لە فیکرە ئازادیخوازیەکانی ناو جاڕنامەی مافەکانی مرۆڤ دەکرد (بگەڕێوە بۆ کتێبی شـۆڕشـی فەڕانسـە لەم زنجیرەیە)، واتە مافی یەکسـان بۆ هەمووان، مسـۆگەرکردنی مافی خاوەنداریەتی و ئازادی پەرەستن. بەڵام ئازادی کۆڕو کۆبونەوە و ڕەخنەگرتن سنووردار دەکرا لە ڕێگەی سانسۆر کرد و پۆلیسی سـیخوڕ. لە یاسـانامە زۆر گرنگی بە خێزان دراوە. ناپلیۆن باوەڕی وابوو کە سـیسـتەمێکی ئەخلاقی پتەو بۆ ڕفتاری دروستی خەڵك پێویستە هەبێت.

لەبەر ئەم هۆکارە ناپلیۆن لە گەڵ کەلیسـایی کاتۆلیك ڕێکەوت. ناپلیۆن ووتی کە ئایینی کاتۆلیك ئاینی زۆرینەی خەڵکی فەڕانسـەیە. لە بەرامبەریشـدا پاپا بەشـە گرنگەکانی ناو یاسـانامەی پەسـەند کرد کە بە پێی ئەم یاسـانامەیە قەشـەکانی فەڕانسـە دەکەونە ژێر کۆنترۆلی حکومەتی فەڕانسـەوە. ناپلیۆن ئەم ڕێکەوتنامەی بە دەستکەوتێکی گەورە لە قەڵەم دا، چونکە حکومەتەکەی لە پشتیوانی کەلیسا سەربەخۆ دەبوو. ڕاستیەکەی ئەو بوو کە ناپلیۆن زگی بە دین و مەسـیحیەت نەدەسـوتا، بەڵکۆ ئەوەی کە لە بۆ ئەو گرنگ بوو کە کەلیسـا نەبێتە

ڕێگر لە بەرامبەر دەسەڵاتەکەی. کاتێك کە لە میسر بوو وا خۆی نیشان دەدا کە موسڵمانە و هەمیشە باسی لە ئیسلام دەکرد. دواتر دەیووت کە ئەگەر حوکمڕانی یەهودیەکانم کردبا ئەوا پەیوەست دەبووم بە پەرستگای پێغەمبەر سولەیمانەوە.

ناپلیۆن بە هۆی جێگیر کردنی یاسانامەی نوێ و کۆتای هێنان بە ناکۆکیەکانی نێوان کەلیسا و دەوڵەت وەکوو ئەوە وابوو کە ئاو بە ئاگردا بکەی. بەم هۆیەوە خواستی خەڵکی بەدیهێنا لەمەڕ هێمنی و ئاسایشی وڵات و هەروەها ئەو پشتیوانی جوتیارە مەزهەبیەکانیشی بە دەست هێنا. دواتر بە هۆی بونیادنانی بانکی فەڕانسە لە هاوشێوەی بانگی ئینگلتەرا، بازرگانەکانیشی بۆ لای خۆ ڕاکێشا. ئەم بانکە یارمەتیدەری حکومەت بوو لەوەی کە پارەی لە دەستدابێت و قەرز بدات بە بازرگان و کارخانەکان.

لەسەرنانی تاجی پاشایەتی. ناپلیۆن تاج لە دەستی پاپا وەردەگرێت و لەسەری دەنێ.

ناپلیۆن هاوسەنگیەکی دروستکرد بە هۆی چاکسازیەکانیەوە لە نێوان ئەندیشە نوێیەکان و شۆڕش، بیروباوەڕ کۆنەکانی خەڵك و پێویستەکانی سەردەم، لەبەر ئەمە چاکسازیەکانی پایەدار مایەوە. ناپلیۆن بیروباوەڕی دیموکراسیانە( خەڵك سالاری) نەبوو، ڕێگەی نەدەدا کە خەڵك شێوەی حکومەت دیاری بکەن. لە ساڵی ١٨٠٢ خۆی وەکوو کۆنسوڵی یەکەم بۆ هەمیشە هەڵبژارد. ڕێگەی لە گفتوگۆی ئازاد گرت و ئیزنی بە کەس نەدەدا دژایەتی بکەن. ڕێگەی دەدا کە خەڵك دەنگ بدەن بۆ بابەتی گرنگ، هەڵبەت ئەو کاتەی کەلەوە دڵنیا بوایە کە خەڵك هاوڕا دەبن لە گەڵ پێشنیارەکەی. وادیارە کە ئەم بابەتە بۆ خەڵکی فەڕانسە لەو سەردەمە زۆر گرنگ نەبووبێت. تەنها ئەو شتەی کە ئەوان خوازیاری بوون حکومەتێکی پتەو و شایستە بوو، واتە ئەو شتەی کە ناپلیۆن بۆی بەدیهێنابوون.

وێنەیەك كە ئینگلیزەكان كێشاویانە. جێژنی لەسەرنانی تاج نیشان دەدات.

## ئیمپراتۆریەتی ناپلیۆن: باڵادەستی بەسەر ئەوروپادا

لە ساڵی ١٨٠٤، ناپلیۆن، بە شكۆیەكی زۆر و لە حوزوری پاپا، تاجی لە سەرناو و خۆی وەكوو ئیمپراتۆری فەڕانسە ناساند. ئەم ڕووداوە خاڵێكی وەرچەرخان بوو لە حكومەتەكەی ناپلیۆن. لە گەڵ ئەوەی پێشتر ستەمكاری و بێ ڕەحمی ناپلیۆن دەركەوتبوو ، بەڵام كردارەكانی بۆ خێر و چاكەی فەڕانسە بوو. بەڵام لە دوای ساڵی ١٨٠٤ زیاتر كردارەكانی بۆ خێر و چاكەی خۆی و تەماحی زیاتر بوو. تاجی ئیمپراتۆری ڕەمزی ئیمتیاز و حكومەتی توندوتژی بوو لەبەر ئەوە بێ ڕێزییەك بوو بەرامبەر ئارەزووەكانی شۆڕش.

هەتا دەهات و ناپلیۆن هێز و دەسەڵاتەكەی زیادی دەكرد. پلانی هەبوو بۆ هێرش كردنە سەر ئینگلتەرا بەڵام نێلسۆن فەرماندەی دەریایی لە ساڵی ١٨٠٥ لە ترافالگار پلانەكەی پوچەڵكردەوە، بەڵام لە هەمان ساڵ ناپلیۆن توانی لە ئەوستێر لیتز گەورەترین سەركەوتن بەدەست بێنێت، بەو مانایەی سوپا هاوپەیمانیەكەی ڕوسیا و نەمسای تێكشاند. ئێستا ناپلیۆن سەربەست بوو لەوەی كە نەخشەی ئەوروپا لە سەرڕا دارێژێتەوە و ئەو كارەشی كرد.

لە هەموو ئەو وڵاتانەی كەوتبوونە ژێر زەختی ناپلیۆنەوە، سوودەكانی شۆڕشی فەرانسە خۆی نیشان دا، واتە فئودالیسم و حكومەتی نەجیبزادە وەلانران، یاسانانەی ناپلیۆن خرایە ڕوو، سنورداریەكانی دژ بە جووەكان وەلانران. زۆر شتی دیكە وەكوو یەكەكانی پێوانەی گۆڕانیان بەسەرهات. هەروەها نواندنی دەدەیی شوێنی سیستەمی ژمارەیی كۆنی گرتەوە. ئەم گۆڕانكاریە یارمەتیدەر بوو بۆ گەشەی بازرگانی.

بڕیاری ناپلیۆن بۆ لە ناوبردنی ئینگلتەرا كە دوژمنی سەرسەختی بوو، وای لێكرد كە بەرەو نیزامی كیشوەری بڕوات.(مەبەست لە كیشوەری یان قارەیی بریتیە لە هەموو كیشوەری ئەوروپا) مەبەست لەم كارەی ئەوەبوو كە هەوڵ بدات هەموو وڵاتانی ئەوروپا لە ڕووی بارزگانیەوە لە بەریتانیا دوور كەونەوە. بەم كارەی ناپلیۆن دەیوست بەریتانیا كاڵاكانی نەفرۆشرێت و بەم پێیە دوچاری زیانی زۆر بێتەوە، بەم كارەی ببێتە هۆی بێكاری و قەیرانی

ئابووری و له کۆتایدا ئەو ولاتە لەم ڕێگەوە شـــکســـت پێ بهێنێت. بەلام ناپلیۆن هەرگیز نەیتوانی ڕێگری له بازرگانی قاچاغی کالاکانی بەریتانی بگرێت. بەریتانیەکان لەم ڕێگەیەوە کڕیاری زۆر لە ئەوروپا بەدەست بێنن.

جەنگی ترافالگار

ئینگلتەرا له ئەمریکای باکوور و له ڕۆژهەلات بازاڕی بازرگانی دیکەی دەســـتەبەر کرد. بەلام (ســـیســـتەمی کیشوەری) کاریگەری زۆری هەبوو له ئەوروپا. له هەموو شوێنێك بازرگانەکان توڕەبوون له خۆتێهەلقورتانەکانی ناپلیۆن له کاری بازرگانی. مالیاتی زۆری جەنگ، بەزۆر بردنی گەنجان بۆ ناو ســـوپا و نیگەرانی خەلکی له فەرمان و ڕێگریەکانی فەرمانڕەواکەیان، هەموو ئەمانە وای کرد بوونە هۆی ئەوەی کە دەســـت بدەنە دەســـتی یەك کە نەتەوە ئازادکراوەکانی ئەوروپا دژ بە ناپلیۆن هان بدەن. دواتر ناپلیۆن دەیوت مەبەستی بووە کە هەموو سنورەکان وەلابنێ و میلەتێکی یەك پارچەی گەورە و شارستانیەتێك لە ئەوروپا دروست بکات. له ڕاستیدا خالی گرنگ له بارەی نەتەوەگری لێرەوە دەستی پێکرد کە تێیدا دانیشتوانی ئەلمان و ئیتالیا بۆ یەکەم جار قسەیان لە بارەی نەتەوەی خۆیان دەکرد، بەو مانایەی کە خۆیان بە ئەلمانی دەزانی نەك دانیشـــتوانی ڕووباری ڕاین یان خۆیان بە ئیتالی دەزانی نەك دانیشـــتوانی جینوائی یان ڕومی. ( له بارەی یەکگرتووی ئەلمان بگەڕێوە بۆ کتێبەکانی بیسمارك و مرۆڤ و نەتەوە لەم زنجیرەیە).

چاکسازیەکانی ناپلیۆن تەنها ئەو ولاتانەی نەگرتبووە کە له ژێر دەسـەلاتی حکومەتی فەڕانسـه بوون. بەلکو له ولاتانی بالکان پەیوەندی له گەل فەڕانسیەکان ڕووی له زیادبوون کرد، هەتا وای لێهات کە کەشتیە بازرگانیەکانی یۆنان ڕووی له زیادبوون کرد و جێگەی بەتالی کەشـتیەکانی بەریتانیا و فەڕانسـەی پڕ کردەوە. هەندێك گروپە

**بازرگانی زاڵ دەبێ بەسەر ئابلۆقەی ئابووری. کاریکاتێرێك لە ساڵی ١٨٠٧ کێشراوە.**

**بازرگانەکان بیر و فیکری یاسای باشتریان بڵاو دەکردەوە. دەستیان کرد بە دژایەتی کردنی حکومەتی عوسمانی . دواتر بە شێوەی کرداری لە ساڵی ١٨٠٤ لە سربستان شۆڕش دەستی پێکرد.**

**لە پرۆسیا و لە هەندێ لە وڵاتانی دیکە، ئەوانەی کە خۆشیان لە فەڕانسە نەدەهات دەستیان کرد بە چاکسازی. ئەوان تێگەشتبوون کە حکومەت و سوپای فەڕانسە لە هی خۆیان باشترە، و بۆ شکست هێنان بە فەڕانسە دبوایە وڵاتەکانی خۆیان وەکوو فەڕانسە مۆدێرنیزە بکەن. پرۆسیا، کە شەرمەزار بوو بە هۆی شکست هێنانی لە بەرامبەر فەڕانسە بۆیە دەستی کرد بە چاکسازی بەرفراوان. بانکی دەوڵەتی شکڵێکی نوێی وەرگرتبوو، بازرگانی لە کۆت و زنجیری یاسا کۆنەکان ڕزگاری بوو و بارودۆخی حکومەتی ناوچەیی باشتر بوو. خەڵکی گونجاویان بانگێشتی ناو سوپا کردوو و ئەفسەرەکان پێکهاتبوون لە هەموو چینەکان، نەك تەنها لە نەجیبزادەکان. بارودۆخی پەروەردەو فێربوون و خزمەتگوزاری ڕەونەقێکی باشی بەخۆیەوە بینی. کاریگەری گشتی ئەم گۆڕانکاریانە ئەوە بوو کە دەوڵەتی پرۆسیا کارامەتر بوو و ئەوانەی کە نەجیبزادە نەبوون هاندەدران بۆ ئەوەی کە پشکێکی زیاتر لە ژیان و کاروباری حکومەت بگرنە ئەستۆ. بەم پێیە لە مۆدێرنیزە کردن، پرۆسیا، ناپلیۆنی کردە سەرمەشقی خۆی و ئەم بابەتە ڕێگەی بۆ یەکپارچەیی ئەڵمان خۆش کرد.**

**هەڵۆیەکی فەڕانسەوی کە ئامادەیە بۆ فڕین(کڵاوی سەربازی) ناپلیۆن نیشان دەدا، دەریای سوور کە گەرووی نیشان دەدات نیشانەیە بۆ نقوم بوونی سوپاکەی ناپلیۆن. ڕوخساری بریتیە لە وێنەی ڕووتی ئەو قوربانیانەی بەدبەخت بوون بە هۆی مەقام خوازی ناپلیۆنەوە. دەستێك کە لە جیاتی نیشانەی سەربازی دانراوە کە کۆنفدراسیۆنی(ڕاینی) دەکێشێتە ژێر نومادی تۆڕی جاڵجاڵۆکە. جاڵجاڵۆکە واتە هۆشیاری هاوپەیمانان. ( ئەم کاریکاتۆرە ئەڵمانیەکان لە ساڵی ١٨١٣ وەکوو ڕقێك بەرامبەر ناپلیۆن کێشایان. لەسەرەوەی وێنەکە نوسراوە فەرمانداری دورگەی ئەلب).**

لە بەریتانیا، بە هۆی کاریگەری ئەم جەنگانە، پیشەسازی پێشکەوتنی بەرچاوی بەخۆیەوە بینی. داواکاری زۆر بۆ چەك و چۆڵ بووە هۆی گەشەی بازرگانی ئاسن و پیشەی ئەندازیاری و سیستەمی کیشوەری وای لە بازرگانی بەریتانیا کرد، کە شوێنی بەسوودتر دەستەبەر بکات لە ئەمریکای لاتین و ئاسیا.

تابلۆیەك کە فرانسیسکۆ گویا کێشاویەتی. باس لە دڕەندەی و بەڵاکانی جەنگ نیشان دەدات. ئەم وێنەیە یەکێکە لە دەیان وێنەی دیکە کە گویا کێشاویەتی تا مەترسی و ترسناکی جەنگی گەریلای نیشان بدات.

سەختترین ڕووبەڕووبونەوە لە بەرامبەر ناپلیۆن لە دواکەوتوترین بەشەکانی ئەوروپا لە ئیسپانیا بوو، لە ساڵی ١٨٠٨ ناپلیۆن براکەی، ژوزێف خستە سەر تەختی دەسەڵات و بنەماڵەی حوکمڕانی ئیسپانیای وەلانا. ئامانجی سەرەکی ئەوە بوو کە ڕێگر بێت لە بەریتانیا کە لەوەی لە ڕێگەی ئیسپانیاوە بێتە ناو بازاڕەکانی ئەوروپا. بەڵام زۆرێك لە جوتیارە ئیسپانیەکان، کە حوکمڕان و کەلیسای خۆیان خۆش دەویست لە ژێری فەرمانی قەشەکان هاوکاری هێزکێکی گەریلای بەریتانیان کرد لە ژێر فەرماندەیی دۆکی ویلینگتن لە دژی فەڕانسیەکان. ناپلیۆن لە ساڵی ١٨٠٩ کە زۆریشی پێویست بە سەرباز بوو بەڵام ناچار بوو کە ٢٥٠,٠٠٠سەرباز لە ئیسپانیا بهێڵێتەوە لە جەنگێك بەژداربن کە هیچ شانسێکی بردنەوەیان نەبوو.

له سالّی ١٨٠٩ نەمسایەکان دووباره جەنگیان دژ بە فەڕانسە ڕاگەیاند. ناپلیۆن دەستکەوتێکی گەورەی بەدەست هێنا لەو جەنگە، وەکوو بەشێك لە بەیاننامەی ئاشتی هاوسەرگیری لە گەلّ ماری لوئیز، کچی ئیمپراتۆری نەمسا کرد. کاتێك هەوەڵین کوڕی لە سالّی ١٨١١ لە دایك بوو، وەکوو پاشای ڕۆم ناساندیان. لەمە بەدواوە ناپلیۆن هەوڵیدا کە خۆی سەرەتای خانەدانێك بێت، واتە خانەدانی ناپلیۆن.

کاریکاتۆرێك لە سەر پلانەکانی ناپلیۆن بۆ دروستکردنی خانەدانێکی نوێی ئەورووپای

## کەوتنی ئیمپراتۆریەت

لە کۆتایدا کەوتنی ناپلیۆن یەکجاری بوو بە هۆی هێرش کردنە سەر ڕوسیاوە. هەر دوو ولّات لە سالّی ١٨١٢ خۆیان ئامادە کرد بۆ جەنگ. سوپا گەورەکەی ناپلیۆن پێکهاتبوو لە ٦٠٠,٠٠٠ کە تەنها بەشێکی کەمیان فەڕانسی بوون. ڕوسیەکان بە ٢٠٠,٠٠٠ پاشەکشەیان کرد بۆ ناو ولّاتە پان و بەرینەکەیان و هەرچیەکیان هەبوو سوتاندیان بۆئەوەی دەژمنەکانیان نەتوانن سوود لە ئەسپ و خۆراك وشتی تر وەربگرن. هەلّاتن و نەخۆشی سەربازەکان لە ماوەی شەش هەفتەدا سوپاکەی ناپلیۆنی کەم کردەوە بۆ نیوە، بەلّام ناپلیۆن گوێی بە قسەی داواکاری فەرماندەکانی نەدا لەوەی کە دەیانوت هەتا زستان نەهاتووە با بکشێنەوە. سەرەنجام ڕوسەکان گەڕانەوە بۆ بورودینوو کە لە گەلّ فەڕانسیەکان بجەنگن؛ ناپلیۆن سەرکەوت بەلّام ٣٠,٠٠٠ نەفەری لە سوپاکەی لە دەستدا. کاتێك هەفتەیەك دواتر چووە ناو مۆسکۆ، بینی کە پایتەخت کەسی لێ نەماوە. کەسی لێ نەمابوو کە خۆی بەدەستەوەبدات و ڕۆژی دواتر ئاگرێك کەوتەوە لە لایەن دەستێکی نەناسراو کە نیوێك لە شارەکەی سوتاند. ئەم ڕووداوە مانگێك بەر لەوە بوو کە ناپلیۆن لەوە تێبگات کە هیچکات ناتوانێ شکست بە ڕوسیا بهێنێت. ئەم ولّاتە پان و بەرینتر لەوەبوو کە بتوانرێ داگیر بکرێت و خەلّك بە شێوەیەکی سەیر وەفادار بوون بە تێزار( ئیمپراتۆری ڕوسیا). لە ١٠/١٩ بەدبەختی پاشەکشە لە مۆسکۆ دەستی پێکرد. تا ناپلیۆن گەیشتە سنووری ئەلّمان تەنها ٣٠,٠٠٠ کەس لە سوپای سەرەکی مابویەوە.

ئەوروپای ژێر دەسەڵاتی ناپلیۆن ساڵی ١٨١٠

پاشەکشە لە مۆسکۆ. ئەم وێنەیە بەدبەختی و نەهامەتی سەربازەکانی فەڕانسە نیشان دەدات.

کاتێك ناپلیۆن گەشتەوە پاریس سوپایەکی تازە نەفەسی دەستەبەرکرد، بەڵام بەزووی تێگەیشت کە ڕووبەڕووی بەهێزترین هاوپەیمانی بۆتەوە، واتە هاوپەیمانی ئینگلتەرا و ڕوسیا، کە سەرسەختەرین دوژمنەکانی ئەو بوون. نەمسا کە پێشتر هاوپەیمانی ناپلیۆن بوو، هەروەها پرۆسیا و وزۆرێك لە وڵاتە بچوکەکانی دیکەش هەموو دژ بە ناپلیۆن یەکیان گرت. لە بەهاری ساڵی ١٨١٣ جەنگ دەست پێکرد و ناپلیۆن سەرکەوتنی بەدەستهێنا، بەڵام دواتر گەروەترین شکست یەقەی گرت و ناچار بوو کە ٦٠,٠٠٠ نەفەر لە سوپاکەی جێ بهێڵێ و بگەڕێتەوە بۆ پاریس. دۆکی ویلنگتۆن لە ئیسپانیاوە هات و لە فەڕانسە پێشڕەوی کرد. فەڕانسیەکان هەواڵیان پێگەیشت کە بۆ یەکەم جار لە دوای ٢٠ ساڵ جەنگ لە ناو خۆی وڵاتەکەی خۆیان ڕوودەدات، لەبەرئەوە بە کۆمەڵ دەستیان کردە پشت کردن لە ناپلیۆن. ئەوان بە ڕادەی پێویست ماڵیاتیان دابوو و لە جەنگدا بەژدایان کردبوو. ناپلیۆن، کە وەزیرو فەرماندەکان بە تەنها جێیان هێشتبوو، هەروەها سەربازەکانی هاوپەیمانان لە پاریس نزیك دەبوونەوە، لەم سەختیانەدا بوو کە ناپلیۆن دەستی لە کورسی دەسەڵات بردا، ئەو کورسیەی کە بۆی خۆی دروست کردبوو.

THE BEAR the BULL DOG and the MONKEY

کاریکاتری ناپلیۆن( کە ئەو لە ناوقەد بۆ خوار بەشێوەی مەیمون کێشراوە) ورچی ڕوسی و جۆرە سەگێکی ئینگلیزی نیشان دەدات، کە هێرشیان کردۆتە سەر ناپلیۆن.

فەڕانسیەکان هاتونەتە پێشوازی ناپلیۆن کاتێك لە ئیلەب گەڕاوەتەوە.

دواتر هێزی هاوپەیمانان لە ڤین کۆبونەوە تا بەرنامەی ئاشتی دارێژن. ناپلیۆن دوورکرایەوە بۆ دورگەی ئیلب لە مەدیتەرانە، بەڵام ئەو ڕازی نەبوو لەوێ. دە مانگ دواتر لەوێ هەڵات و گەڕایەوە بۆ فەڕانسە، خەڵکیش پێشوازیان لێ کرد. سوپایەکی چەند هەزار کەسی پێکهێنا و دووبارە بە متمانەوە دەسەڵاتی گرتەوە دەست. دەیگووت: (( من پێتان دەڵێم کە ولینگتن فەرماندەیەکی خراپە، ئینگلیزەکان سەربازی خراپن و ئەم جەنگە وەکوو سەیرانێك وایە.)) لە ڕاستیدا جەنگی واترلوو لە بەلجیکا جەنگێکی تاڵ و سەخت بوو کە بووە هۆی لە ناوچوونی فەڕانسیەکان. ولینگتن دواتر دانی بەوەدانا و دەیووت: (( ئەمە ناوئومێدانەترین کار بوو کە من تا ئەو کاتە ڕووبەڕووی ببومەوە و زۆری نەما بوو کە شکست بهێنم، ئیتر هەرگیز جارێکی تر دووچاری بارودۆخێکی ئەوها نەبوومەوە)). بە هۆی جەنگی واترلۆ فاتیحەی حکومەتی ناپلیۆن خوێندرا. بەریتانیان ناپلیۆنیان دورخستنەوە بۆ دورگەیەکی سارد و بێ دارودرەخت بە ناوی سەنت هیلین لە زەریای ئەتڵەس. ناپلیۆن لە گەڵ دەستەیەك لە شوێنکەوتوان و وەفادارانی لەوێدا مایەوە تاکو سەرەنجام لە ساڵی ١٨٢١ لەوێ کۆچی دوای کرد.

جەنگی واترلو. ئەمە کۆتا شکستی ناپلیۆن بوو.

ناپلیۆن لە ڕێگای سەفەر بۆ شوێنی دورخستنەوەی لە سەنت هیلین.

## ئەوروپا لە دوای ناپلیۆن

وڵاتانی سـەركەوتوو كە دووبارە ڕووبەڕووی دارشـتنەوەی سـنورەكانی ئەوروپا ببونەوە، دەیانهەویسـت لەوە ئەرخەیان بوو كە هیچ وڵاتێك هەرگیز نەتوانی جارێكی تر بە سەر ئەوروپادا زاڵ بێت. زۆرێك لە پاشاكان و ئەو وڵاتانەی بە هۆی ناپلیۆنەوە پەرتەوازە ببون، دووبارە بوژانەوە. فەڕانسـە زۆرێك لە دەسـەڵاتەكەی پاراسـت. گەرچـی تەقریبەن هەموو ئەو سـەرزەویانەی لە ڕێگەی جەنگەوە كە لە ماوەی بیست سـاڵ بەدەسـتیهێنابوو لە دەسـتی دا و ناچـار كرا لە داگیر كردنی وڵاتان بوەسـتێت و خەسـارەتێكی زۆریشـیان لێ ئەسـتاند. بە درێژایی سـنورەكانی فەڕانسـە دەوڵەتی بە هێزی نوێ پەیدا بوون. پرۆسـیا و ڕوسـیا گەورەتر بوون. بەریتانیا لە ماوەی جەنگدا پێشكەوتنی بەرچاوی بە خۆیەوە بینی و ناوچەیەكی ئاوی بەرفراوانی بەدەست هێنا.

## فەڕانسە لە دوای ناپلیۆن

ناپلیۆن لە چەند ڕێگەیەكەوە فەڕانسەی سەروژێر كرد. كۆمەڵەی یاساكانی ناپلیۆن، چاكسازیە پەروەردەیەكان و سەربازییەكانی ئەو تا ئێستاش هەر ماون. بەڵام جەنگە یەك لە دوای یەكەكانی، فەڕانسەی بەرەو ماندووبوون و بێ هێزی برد. ئەو بەڕێوەبەر و فەرماندەیەكی ژیر و دیار بوو. لە ماوەی جەنگدا بە هۆی هێز و تواناكانی خۆی بە دەسەڵات گەیشت. بۆ ماوەی پانزە ساڵ كەسی باڵادەست بوو بە سەر ئەوروپا و هۆكاری شكست هێنانیشی تا ڕادەیەكی زۆر لە ناوچونی هێزی بوو و ئەوەش بە هۆی یەكگرتووی و هاوپەیمانی دوژمنەكانیەوە بوو.

ئەوروپا لە دوای نالپلیۆن. پەیمانی وین ساڵی ١٨١٥

## ناپلیۆن و جیهان

حکومەتی ناپلیۆن کاریگەری گرینگی لە مێژووی ئەمریکای باکور و ئەمریکای باشـــوور هەبوو. ســـەرزەوی ویلایەتە یەکگرتوەکان بەرفراوان بوو، بەو مانایەی کە حکومەتی ئەمریکا موســـتەعمەراتەکانی پێشـــوتری فەڕانسە کە لە خاکی ئەمریکا بوون کڕی، واتە لە نیوئاورلئان بگرە تا ڕوباری میسی پی پی و تا ئۆهایۆ هەمووی لە فەڕانســە کڕیەوە. ئەم ســەوداو مەعامەلەیە کە بە لوئیزیانا ناســراوە لە ســاڵی ١٨٠٣ کۆتای پێهات. هائیتی کە پێشتر موستەعمەرەی فەڕانسە بوو لە هیندی ڕۆژئاوا، هەر لەو سەردەمەدا سەربەخۆی بەدەستهێنا. کۆیلە ڕەش پێستەکان، کە ئیلهامیان لە موژدەی ئەندێشەکانی شۆڕشی فەڕانسەوە وەرگرتبوو، کە هەموو مرۆڤەکان یەکسانن، دەســتیان کرد بە شــۆڕش کردن. (بگەڕێوە بۆ کتێبی بازرگانی کۆیلە لەم زنجیرەیە). ئەوان ســوپاکەی ناپلیۆنیان تێکشکاند کە ناردبوونی بۆ پاراســتنی ئاسـایشی ناوچـەکە، ئەگەر چی سـەرکردەکەیان توسـن لووریتور بە دیلی گیراو ودواتر لە فەڕانسە لە بەندیخانە گیانی لە دەستدا.

ناپلیۆن و ئەمریکای باکور و باشور

هێرشی ناپلیۆن بۆ سەر ئیسپانیا بووە هۆی ڕوخانی ئیمپراتۆریەتی ئیسپانیا لە ئەمریکای باشوور. تا ساڵی ١٨١٠ زۆربەی موستەعمەرەکانی ئیسپانیا دەستیان کرد بە شۆڕش کردن. ئەوان لە ژێر فەرماندەیی سیمۆن بولیڤار و سان مارتین وایان دانابوو کە لە ساڵەکانی ١٨٢٠ سەربەخۆی بەدەست بێنن.( بگەڕێوە بۆ کتێبی سیمۆن بۆلیڤار لەم زنجیرەیە). هەر بە هۆی هێرشی ناپلیۆنەوە خانەدانی پاشایەتی پۆرتوگال لە بەرازیل هەڵات، کە موستەعمەرەی پۆرتوگال بوو. ئەوان لە ساڵی ١٨١٥ گەڕانەوە، بەڵام جێنشین لە بەرازیل مایەوە و لە ساڵی ١٨٢٢ بانگەشەی سەربەخۆیی دەکرد. ئەو بە باوك و هەوەڵین ئیمپراتۆری بەرازیل نێودێر کرا.

لەوەڕا کە ناپلیۆن دەیهەویست بەریتانیا لە بازرگانی ئەوروپا دورخاتەوە، بازرگانە بەریتانیەکان دەرگای بازرگانیان لە گەڵ ئەمریکای باشور کردەوە. ئەم کارە بووە هۆی پشتوانی بەریتانیا لە گروپە ئازادی خوازەکان.

ناپلیۆنیش زیاتر مەیلی بەرەو لای باکووری ئەفریقا و ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست چوو. هێرشەکەی ساڵی ١٧٩٨ بۆ سەر میسر تازە سەرەتای کار بوو. جاروبار لە گەڵ ئیمپراتۆریەتی عوسمانی و ئێران پەیماننامەی دەبەست، و سەربازەکانی خۆی دەنارد بۆ ئەو وڵاتانە بۆ مەشق کردن بە سەربازەکانی ئەوان. نێردراوەکانی فەڕانسە چوونە ناو زۆرێك لەو وڵاتانەوە. لە ئەنجامدا دوو شت ڕوویدا: یەك ئەوەی کە وڵاتەکانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست هۆگری دابونەریتی فەڕانسیەکان بوو، و دواتر دەستیان کرد بە لاسای کردنەوەی ئەوان. دووەم ئەوە بوو کە بەریتانیا پێی خۆش نەبو کە نێردراوە فەڕانسیەکان نزیکی هیندستان ببنەوە کە موستەعمەرەی بەریتانیا بوو. لەبەر

هەندێ سـەرباز  ونێردراوی ئەوانیش کەوتنە ڕێ بۆ ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاسـت. ئەمە سـەرەتای مێژوویەکی درێژی کێبڕکێی ئەوروپیەکان بوو لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست.

## فیکری ناپلیۆن

ناپلیۆن لە مێژووی جیهان پیاوێکی ناسـراوە نەك لەبەر ئەو کارانەی کە لە فەڕانسـە و وڵاتانی دیکە ئەنجامی داوە، بەڵکو زیاتر بە هۆی کاریگەری بۆ سـەر هەسـتی مرۆڤەکانەوەیە لە بارەی هێز و دەسـەڵاتیەوە. بەر لە سـەردەمی ناپلیۆن فیکری خەڵك لە بارەی شـتەکانەوە زۆر سـنورداربوون؛ ئەوان تەنها لە شـتی بچـوك دەفکران. ناپلیۆن فیکری گەورەی لەسـەردا بوو، لە ڕوانگەی زۆربەی خەڵکەوە ئەو توانای ئەنجامدانی هەموو کارێکی هەبوو. ئەوان وا بیریان دەکردەوە کە ناپلیۆن دەتوانێ جیهانێکی باشـتر وەدیبێنێ. گەرچـی جیهانی ناپلیۆن لە بەدبەختیدا کۆتایی پێهات، بەڵام ئەم ئەندێشـەیە لە ناو خەڵکدا هەر مایەوە و لە سـەردەمی دواتر خەڵك چاوەڕوانی ناپلێۆنی نوێ بوون. ناپلیۆن هەوەڵین دیکتاتۆری جۆرێکی نوێ بوو. ئێمە دیکتاتۆرانێکی زۆرمان دیوە بۆنموونە هیتلەر کە دەزانین چ خەراپەو شەڕێکیان لە دەست دێت. بەڵام پەی بردن بە هۆکاری پەیڕەوی کردنی خەڵکی لەمانە گرنگە. بۆیە خوێندنەوە لە بارەی کارەکانی ناپلیۆن دەکرێت یارمەتیدەر بێت لە تێگەشـتنی ئەم خاڵە.